زنجیرە ڕێنماییەکانی دێرین ژمارە ٦٣

# الاختلاط

## تێکەڵی پیاوان و ئافرەتانی نامەحرەم

قالَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم : ( فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ؛ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ). ((الصحيحة)) (486 و911).

واتە: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی:
خۆتان لە دونیا و ئافرەت بپارێزن ، بەڕاستی یەکەمین فیتنەی بەنی ئیسرائیلیەکان لە ئافرەتان بوو .

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی
م. هەڵگورد مصطفی گەلاڵەیی
٠٧٥٠٤١٢٨٢٢٠

پەرتوکخانەی دێرین

لە بڵاوکراوەی پەرتوکخانەی دێرین - سۆران - پێش یاریگا
٠٧٥٠٤١٢٨٢٢٠ - ٠٧٧٠٧٠٠٥٧٦٥ - ٠٧٨٠٣٨٩٢٩٣٩

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

و اله وصحبه ومن تبعهم بإحسان hالحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام علي نبينا محمد إلي يوم الدين ، وبعد .

به پشتیوانی خوای گەوره لەم نامیلکەیەدا باس لە حەرامیەتی و نادروستیەتی تیکەلبوونی پیاوان و ئافرەتانی نامەحرەم دەکەین بە بەلگەی قورئان و سوننەت ، وە باس لە زەرەر و زیانەکانی دەکەین بۆ ئەوەی ببیتە مایەی چاورۆشەنی و ئاگاداری موسولمانان لەو تاوانە ئاشکرایە کە زۆریك لە موسولمانان لیی بیئاگان و تیی کەوتوون.

### بەلگە لە قورئاندا

1 – قال تعالى : [وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلاَ تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلاَةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ..] (الأَحْزَابِ : 33) .

واتە: ئەی ئافرەتان لە مالەکانتان بمیننەوە و بەبی کاری پیویست لە مال دەرنەچن ، وەکو سەردەمی جاهیلیەتی پیشوو زینەت و جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرنەخەن ، وە نویژەکانتان بە جوانی و ریك و پیکی ئەنجام بدەن ، وە زەکاتیش بدەن ، وە hبەردەوام گویرایەلی خوا و پیغەمبەری خوا بن .

ـ زانایان فەرموویانە ئەم ئایەتە بەلگەیە لەسەر حەرامیەتی (إختلاط) تیکەل بوونی ئافرەتان لە گەل پیاوانی نامەحرەم ، چونکە ئەم کردارە کرداری کەسانی سەردەمی جاهیلی پیش هاتنی ئیسلامە .

ئیمامی موجاهید (رەحمەتی خوای گەورەی لیبی) لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی : ئافرەتانی سەردەمی جاهیلی لە مالەوە دەردەچوون و بەناو پیاوانی نامەحرەم دەرۆیشتن و تیکەلیان دەکردن . تفسير ابن كپير : 3/483 .

2 – قال تعالى : [وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ...] (الأَحْزَابِ : 53) .

واته: ئەگەر پرسیار و داوای شتیكتان لە خێزانەكانی پێغەمبەری لە پشتی پەردەوە پرسیاریان لێبكەن و (نابێت تێكەلی ﷺ خوا كرد بكەن و دەبێت لە یەكتر دیارنەبن) ، ئا بەو شێوەیە پاكترە بۆ دلی ئێوە و دلی ئەوانیش (نەك تێكەلی ژن و پیاوی نامەحرەم بكرێت ، چونكە تێكەلی دەرەنجام گەلی شتی خراپی لی ئەوەشێتەوە) .

3 – قال تعالى : ( وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً ) .(الإِسْرَاءِ : 32) .

واته: نزیكی زینا مەكەونەوە ، بەڕاستی ئەوە كردەوەیەكی زۆر ناشرین و ڕێگەیەكی پیس و خراپە .

ـ خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا نەهی كردووە لە گشت ئەو هۆكارانەی دەبنە مایەی تووش بوون بە زینا ، بێگومان تێكەلی بوونی ژن و پیاوی نامەحرەم یەكێكە لە هۆكارەكانی تووش بوون بە زینا ، چەندین كەس هەیە بەهۆی تێكەلیەوە سەیری یەكتریان كردووە و شەیتان گومرای كردوون و پاشان تووشی زینای كردوون ، شتی وا زۆر ڕوویداوە كەس ناتوانێت ئینكاری بكات ، وە با كەس نەلێت من دلم پاكە و هەموو كەسم پی وەكو برایە چونكە مرۆڤ شەیتان دوژمنیەتی و بەردەوام فرمانی شتی خراپی پیدەكات ، هەر وەكو خوای گەورە فەرموویەتی: [إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاءِ] (الْبَقَرَةِ : 169)

واته: بەڕاستی (شەیتان) فەرمانتان پێدەكات بە تاوان و خراپە و داوێن پیسی و زیناكردن .

وە هەروەها مرۆڤ نەفسەكەی بەردەوام فرمانی خراپی پی

دەکات خـوای گـەورە فـەرموویـەتـی: [إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ]يوسُفَ : 53 .

**واته**: بەڕاستی نەفس و دەروون هەمیشە فەرمان بە خراپە دەکات
.

4 – قال تعالى : [يَعْلَمُ خَائِنَةَ الأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ] غَافِرٍ:19

**واته** : خوای گەورە ئاگای لەو چاوە خیانەتکارانە هەیە کە بەدزی و نهێنی سەیری (کچ و خێزان و دایکی) خەڵکی دەکات ، وە زانیاری هەیە بە گشت ئەو شتانەی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە .

ـ ئەم ئایەتە پیرۆزەش یەکێکە لەو ئایەتانەی کە باس لە مەترسی و نادروستیەتی (**إختلاگ**) دەکات ، عبدالله ی کوڕی عەباس (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی : ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لە پیاوێك دەکات (بۆ نموونە) بچێتە ماڵێك لەو ماڵەدا ئافرەتێکی جوان هەبێت ، ئەو ئافرەتە لە بەردەمی پیاوەکە بێت و بچێت ، هەر کاتێك ئەهلی ئەو ماڵە لە پیاوەکە بێئاگابوون یەکسەر پیاوەکە سەیری ئافرەتەکە دەکات ، وە هەر کاتێك ئاگایان لە پیاوەکە بوو یەکسەر چاوەکانی دادەگرێت و سەیری ئافرەتەکە ناکات ، هەر کاتێك بێ ئاگابوون سەیری دەکات ، وە هەر کاتێك ئاگایان لێ بوو چاوی دادەگرێت ، بۆیە خوای گەورە دەزانێت چ لە دڵ و دەروونی ئەو پیاوە هەیە ئەو پیاوە ئەگەر بۆی بڕەخسێت ئامادەیە زیناش لە گەڵ ئافرەتەکە بکات ، بۆیە لە شەریعەتی ئیسلامدا دەبێت پیاوان لە ئافرەتان جیا بکرێنەوە بۆ ئەوەی لە نەزەر کردن و زینا بەدوور بکەونەوە ، چونکە ئەم دوو شتە خراپە بەبێ تێکەڵ بوون بوونیان نیە و نایەنە کایەوە . (الخلوة والاختلاط: 8) .

## بەڵگە لە فەرموودە سەحیحەکان

1 – عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ

قَالَ : [إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ : يَا رَسُولَ اللهِ ، أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ ؟ قَالَ : الْحَمْوُ الْمَوْتُ] . صحيح البخاري: 5232 .

**واتە**: لە عوقبەی کوڕی عامرەوە (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێ) فەرمووی : ووشیار و ئاگادار بن لە فەرمووی: پێغەمبەری خوا چوونتان بۆ لای ئافرەتانی نامەحرەم ، پیاوێك لە ئەنسارییەکانی ئەی چوونە لای شاری مەدینە فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا خێزانی برا حوکمی چییە؟ واتە: (تێکەڵ بوون و مانەوە لە گەڵی) فەرمووی : تێکەڵ بوون و مانەوە لە گەڵ خێزانی برا هەر مردنە (واتە زۆر ترسناکە و حەرامە و دروست نیە) .

ـ لە ئیسلامدا نەزەرکردن یان تێکەڵ بوون حەرامە لە گەڵ براژن یان کچە مام یان کچە پوور یان کچە خاڵ یان ماموژن یان خالۆژن وە غەیری ئەوانیش کە لەسەر پیاو بە هەتا هەتایی حەرامنین بۆمارەکردن ، لە ئیسلامدا دوو جۆر مارەکردنی حەرام کراو هەیە کە ئەم دوانەن (مُحَرَّمَة أَبَدِيَّة وَمُحَرَّمَة مُؤَقَّتَة) حەرامکراوی ئەبەدی ئەو ئافرەتانەن کە پیاو بە هیچ شێوەیەك هەتا هەتایە بۆی نیە مارەیان بکات وەکو دایك و خوشك و پوور و خەسو ، سەیرکردن و تێکەڵ بوون لەگەڵ ئەوانە دروستەو کێشە نیە .

وە حەرام کراوی (مُؤَقَّت) بریتین لەو ئافرەتانەی کە بۆ کاتێکی دیاری کراو حەرامە مارە بکرێن وەکو ژنی برا ، براژن ئەوەندە لە شوبرای حەرامە مارەبکرێت هەتا پیاوەکەی لە ژیاندا ماوە ، هەر

كاتيك پياوەكەی مرد برای پياوەكەی كە دەكاتە شوبرای بۆی هەيە بە شيوەيەكی شەرعی مارەی بكات ، بۆيە زانايان دەفەرموون نەزەری براژن لە شوبرا حەرامە چونكە ئەو ئافرەتە وەكو دايك و خوشك نيە هەتا هەتايە مارەكردنی حەڕام دەبيت.

بۆيە پيويستە موسولمانان لە خوا بترسن و بە فيلەكانی شەيتان هەلنەخەلەتين و بەناوی خۆيەتی و خزمايەتی تيكەلی و نەزەر كردن نەكەن چونكە ئەم كارە ناشەرعيە و زەرەر و زيانی دونيا و دوا ڕۆژی ليدەكەويتەوە .

2 – عن أَبِى أُسَيْدٍ الأَنْصَارِىِّ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ يقُولُ ـ [وَهُوَ خَارِجٌ مِنَ الْمَسْجِدِ فَاخْتَلَطَ الرِّجَالُ مَعَ النِّسَاءِ فِى الطَّرِيقِ ـ فَقَالَ رَسُولُ الله - صلى الله عليه وآله وسلم - لِلنِّسَاءِ: «اسْتَأْخِرْنَ فَإِنَّهُ لَيْسَ لَكُنَّ أَنْ تَحْقُقْنَ الطَّرِيقَ، عَلَيْكُنَّ بِحَافَاتِ الطَّرِيقِ». فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تَلْتَصِقُ بِالْجِدَارِ حَتَّى إِنَّ ثَوْبَهَا لَيَتَعَلَّقُ بِالْجِدَارِ مِنْ لُصُوقِهَا بِهِ] . الصحيحة 856 .

واتە: ئەبی ئوسەيدی ئەنساريەوە (ڕەزای خوای گەورەی لی بی) فەرمووی كاتيك لە دەرەوەی مزگەوت – لە ڕيگادا پياوان و بە ئافرەتان تيكەلی بوون گويی لە پيغەمبەری خوا بووە ئافرەتانی دەفەرموو: خۆتان دوابخەن بەراستی بۆ ئيوە نيە لە ناوەراستی ريگادا برۆن ، بە تەنيشتی ريگاكەدا برۆن ، لە دوای ئەو ، ئافرەتان خۆيان لە ناو پياوان جيا هفەرمانەی پيغەمبەری خوا كردەوە ئافرەتی وا هەبوو ئەوەندە خۆی لە ناوەڕاستی ريگاكە دوور دەكردەوە خۆی بە ديواری ريگاكەوە دەلكاند هەتا پۆشاكی بەديوارەكەوە دەلكا بەهۆی نزيك بوونەوەی لە ديوارەكە .

ـ لەم فەرموودەيەدا بۆمان دەردەكەويت كەوا پيغەمبەری خوا نەهی كردووە لە تيكەلی بوونی پياوان و ئافرتان لەناو ريگادا ،

ئەگەر تێکەڵی لە بەردەم مزگەوت و لەناو ڕێگاکان حەرام بێت ئەی چۆن لەناو غورفە و هۆڵ و سەیرانگاکان جائیزە؟

وە ئەم فەرمووده فائیدەی ئەوەشمان پێدەدات کەوا ئافرەتانی گوێڕایەڵ و بە تەقوا و لە خواترس hسەردەمی پێغەمبەری خوا کردووە و خۆیان hبوونە ، یەکسەر گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوایان لە پیاوان جیا کردۆتەوە ، بەڵام ئافرەتانی ئەم سەردەمە زۆربەیان لە جیاتی خۆیان لە پیاوانی نامەحرەم بەدوورگرن و تێکەلیان نەکەن زۆر بە ئاسایی تێکەلیان دەبن و پێکەنین و قسەی بێ پێویستیان لە گەڵ دەکەن ، وە گاڵتەش بەو پیاو و ئافرەتانە دەکەن کە لە خوا ئەترسن و ئەم تێکەلیە ناشەرعیە ناکەن .

قالَ رسولُ اللهِ 3h – فِي ( فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ ؛ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ). ((الصحيحة)) (486 و 911) .

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: خۆتان لە دونیا و ئافرەت hواتە: بپارێزن ، بەڕاستی یەکەمین فیتنەی بەنی ئیسرائیلیەکان لە ئافرەتان بوو .

پێغەمبەری خوا لەم فەرموودەیەدا h بە دەکات پێ فەرمانمان خۆپاراستن لە ئافرەتانی نامەحرەم ، بێگومان یەکێك لە هۆکارەکانی خۆپاراستن لە ئافرەتانی نامەحرەم بریتیە لە خۆ بەدوورکردن لە (**إختلاك**) تێکەڵی ، بۆیە ئەو فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر حەرامیەتی (**إختلاك**) .

قالَ رسولُ اللهِ 4h ـ ( الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ , وَإِنَّهَا إِذَا خَرَجَتْ ؛ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ , وَإِنَّهَا لاَ تَكُونُ إِلَى وَجْهِ اللَّهِ : أَقْرَبَ مِنْهَا فِي قعرِ بيتِها ) . صحيح ـ ((التعليق الرغيب)) (1/ 136) , ((الإرواء)) (1/ 303/273) .

فەرموویەتی : ئافرەت عەورەتە ، کاتێك لە ماڵەوە دەرئەچێت ، شەیتان لەبەر چاوی پیاوانی نامەحرەم دەیرازێنێتەوە ، بەراستی چاکترین شت بۆ ئافرەت بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنێت مانەوەیەتی لەناوە ماڵەکەی .

ـ لەم فەرموودەیەشدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا ئافرەت نابێت تێکەڵی پیاوان بکات ، چونکە شەیتان لەبەر چاوی پیاوانی نامەحرەم دەیرازێنێتەوە ، وە چاکترین شوێنی ئافرەت ماڵەوەیەتی دوور لە تێکەڵی پیاوانی نامەحرەم ، وە خراپترین شوێنیشی دەرەوەو تێکەڵ بوونیەتی لەگەڵ پیاوانی نامەحرەم .

وە زۆر بەڵگەی تر هەیە لە قورئان و سوننەت لەسەر حەرامیەتی تێکەڵی پیاوان و ئافرەتانی نامەحرەم ، بەڵام لەبەر بچوکی قەبارەی نامیلکەکە تەنها مەجالی باسکردنی ئەوەندە بەڵگانەمان هەبوو ، وە هەر کەسێك حەق ویست بێت تەنها یەك بەڵگەی بەسە ، بەڵام کەسێك حەقی نەوێت هەزار بەڵگەشی بۆ باس بکرێت سودی نیەو وەری ناگرێت ، خوای گەورە بمان پارێزێت لەشوێن کەوتنی هەواو ئارەزوو .

1 – نەزەرکردن

2 – نەمانی غیرەت .

3 – نەمانی شەرم و حەیا .

4 – تیك چوونی ڕەوشت و ئەخلاق .

5 – زۆربوون و بلآو بوونەوەی زینا .

6 – تووشبوون بە نەخۆشی (عشق) دلداری .

7 – زۆربوونی تەلآق بەهۆی خیانەتی زەوجی .

8 –تەوقەکردن و لە یەك خشان و بەیەك کەوتن .

9 –بەدەر کەوتنی جوانی و لاشەی ئافرەتان بۆ پیاوانی نامەحرەم

.

10 – زۆری کەوتن لە وانەکان لەو قوتابخانانە و پەیمانگاو کۆلیژانەی تیکەلاون . (الخلوه والاختلاگ: 25).

وصلی الله علی نبینا محمد

hواله وصحبه وسلم

28 رجب 1436 ه – 5/17/ 2015 م

سۆران